# لە تایبەتمەندی

# سورەتەکان

وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا


ئامادەکردنی: فایز بن سیاف السَّریع

وەرگێڕانی: هشام لطیف بەرزنجی

پێداچوونەوەی: م. صلاح الدین عبدالکریم

## ١- سورەتی فاتیحە

١- گەورەترین سورەتە لە قورئانی پیرۆز.
٢- ڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی نوێژ.
٣- ڕوقیەیە بۆ نەخۆشییەکانی دڵ و لاشە.
٤- هەموو سورەتەکانی تر ڕونکەرەوەی ئەم سورەتەیە.

## ٢- سورەتی بەقەرە

١- لە ڕۆژی دوایی بەرگری لەو کەسە دەکات کە خوێندوویەتی.
٢- دەست پێوەگرتنی بەرەکەتە، وە وازهێنان لێی حەسرەت و پەشیمانییە، وە ساحیرەکان پێی ناوێرن و لە حەقی نایەن. (چونکە پارێزەرە و ئەو کەسەی بیخوێنێت دەپارێزرێت لە سیحر).
٣- ئایەتێکی تیایە کە کۆتا ئایەتە دابەزیوە لە قورئان. (خیلاف هەیە لەسەری).
٤- درێژترین سورەتە لە قورئان.
٥- ئەم سورەتە هەزار فەرمان و هەزار قەدەغەکردن و هەزار هەواڵ لەخۆدەگرێت. (وتەی ئیبنول عەرەبی یە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) -وەرگێڕ-).

## ٣- سورەتی ئالی عیمران

١- لە ڕۆژی دوایی بەرگری لەو کەسە دەکات کە خوێندوویەتی.
٢- تەنها سورەتێکە کە ئایەتی موحکەم و موتەشابیهی لەخۆگرتووە.
٣- تەنها سورەتێکە ئایەتی موباهەلەی تیایە. (ئایەتی ٦١ دەکات).
٤- تەنها سورەتێکە بەناوی یەکێک لە خانەوادەکانەوە ناو نراوە، ئەویش خانەوادەی ئالی عیمرانە.

## ٤- سورەتی نیساء

١- تەنها سورەتە باسی میراث دەکات.
٢- (٣٠) ناو لە ناوەکانی خوای گەورەی تیایە.
٣- لە دوو ئایەت ناوی (١٢) پێغەمبەر هاتووە (سەلامی خوایان لێبێت).
٤- بەتایبەت لەم سورەتە باسی حەق و مافەکان و هەڵس و کەوتی خێزان لەگەڵ یەکتری باسکراوە.[١]

---

(١) ئایەتی دەمافەکەی بەتایبەت تێدا باسکراوە (م. صلاح الدین).

## ٥- سورەتی مائیدە

١- ئەم سورەتە بە تایبەت تەواوکەری ئایەتی قەرزە. (ئەوەی لە سورەتی بەقەرە باسکراوە لێرە تەواوی دەکات).

٢- لەم سورەتە زۆر بانگ لە باوەڕداران دەکات.

٣- گشتگیرترین سورەتە کە باس لە حوکمەکانی شەریعەت بکات لە ڕووی حەرام و حەڵاڵ و فەرمانکردن و قەدەغەکردن.

٤- تەنها سورەتە باس لە کوڕەکانی ئادەم دەکات.

## ٦- سورەتی ئەنعام

١- ئەم سورەتە بە یەکجار دابەزی.

٢- کۆکەرەوەترین سورەتە کە باسی حاڵی عەرەب دەکات لە سەردەمی نەفامیدا.

٣- باسی هەژدە پێغەمبەر (سەلامی خوایان لێبێت) لە چوار ئایەت باسکراوە.

٤- لەم سورەتە بە تایبەت باسی دە وەسیەتەکە دەکات کە لە هەموو کتێبە ئاسمانییەکان هاتووە.

## ٧- سورەتی ئەعراف

١- درێژترین سورەتی مەککیە.
٢- چوارجار بانگ لە نەوەی ئادەم کراوە.
٣- لەم سورەتە بە تایبەت باسی میثاق (پەیمان وەرگرتن لە نەوەکانی ئادەم) کراوە. (ئایەتی ١٧٢-١٧٣).
٤- تەنها لەم سورەتە باسی ئەهلی ئەعراف کراوە. (ئایەتی ٤٦-٤٩).

## ٨- سورەتی ئەنفال

١- تەنها سورەتە بە (یسئلونک) دەست پێدەکات.
٢- لەدوای غەزوەی بەدر دابەزی.
٣- بەسەر هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێت) دەخوێندرایەوە لە شەڕەکاندا.
٤- باسی دوو ئەمان و سەلامەتی تیاکراوە لە سزای خوای گەورە. (ئایەتی ٣٣).

## ٩- سورەتی تەوبە

١- تەنها سورەتە بە (بسم الله الرحمن الرحيم) دەستی پێ نەکردووە.
٢- لە هەموو سورەتەکانی تر زیاتر باسی حاڵی دووڕووەکان دەکات.
٣- لە سورەتەکانی تر زیاتر باسی تەوبەکردن و گەڕانەوە بۆلای خوای گەورە دەکات.
٤- زۆرینەی ئایەتەکانی لەدوای غەزای تەبوک دابەزی.

## ٩- سورەتی یونس

١- یەکەم سورەتە لە ڕیزبەندی موصحەف بەناوی پێغەمبەرێکەوە (سەلامی خوای لێبێت) دەست پێ دەکات.
٢- یەکێک لەو پێنج تەحەددایەی تیایە کە هەموو عەرەب نەیان توانی وەکو قورئان بهێنن (ئایەتی ٣٨).
٣- تەنها لەم سورەتە باسی کاتی نوقم بوونی فیرعەون دەکات کەچی وت.

## ١١- سورەتی هود

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەربارەی فەرموویەتی: «سورەتی هود پیری کردم».

٢- یەکێک لەو پێنج تەحەددایەی تیایە کە هەموو عەرەب نەیان توانی وەکو قورئان بهێنن (ئایەتی ١١).

٣- لە هەموو سورەتەکانی تر زیاتر باسی پێغەمبەر نوحی (سەلامی خوای لێبێت) تیا کراوە.

٤- پێنج جار ناوی پێغەمبەر هود (سەلامی خوای لێبێت) هاتووە.

٥- تەنها سورەتە باسی خۆشبەختی تیا کرابێت (ئایەتی ١٠٥ و ١٠٨).

## ١٢- سورەتی یوسف

١- لەم سورەتە بەتایبەت باسی چیرۆکی پێغەمبەر یوسف (سەلامی خوای لێبێت) کراوە.

٢- یەکێکە لەو سورەتە کەمانەی باسی بەهەشت و دۆزەخی تیا نەکراوە.

٣- ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لە نوێژی بەیانی خوێندوویەتی.

٤- لە هەموو سورەتەکانی تر زیاتر باسی نائومێدی تیا کراوە.

## ١٣- سورەتی ڕەعد

١- تەنها سورەتە کە زانایان ناکۆکییان هەیە لەسەری ئایە مەککی یە یان مەدەنی یە.
٢- کۆتا سورەتە لە ڕیزبەندی موصحەف دەست پێدەکات بە چوار پیت.
٣- یەکێکە لەو سورەتانەی زۆرترین وشەی بەرامبەر لەخۆگرتووە، وەکو شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگ.

## ١٤- سورەتی ئیبراهیم

١- تەنها لەم سورەتە باس لە نیشتەجێبوونی پێغەمبەر ئیبراهیم صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەکات وە هاجەری خێزانی لەگەڵ مندااڵەکەی ئیسماعیل لە شوێنێک کە هیچ کشتوکاڵێکی لێ نەبوو.
٢- تەنها لەم سورەتە باسی وتاری ئیبلیس دەکات لەناو دۆزەخ بۆ ئەهلی دۆزەخ.

## ١٥- سورەتی حیجر

١- تەنها سورەتە باسی حیجری تیاکرابێت، کە ناوی شوێنێکە بۆ گەلی ثەمود کە پێغەمبەرەکەیان صالح (سەلامی خوای لێبێت) بوو.

٢- ئەو ئایەتەی خوای گەورە ئاماژە بەوە دەکات خۆمان قورئان دەپارێزین لەم سورەتەیە.

٣- لەم سورەتەیە درێژترین وشە لەخۆدەگرێت کە: ﴿ فَأَسۡقَيۡنَٰكُمُوهُ ﴾ [الحجر: ٢٢].

٤- تەنها سورەتە ئەو ئایەتەی تیایە خوای گەورە سوێند دەخوات بە ژیانی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ.

## ١٦- سورەتی نەحل

١- تەنها لەم سورەتە باسی مێشەنگ کراوە لە هیچ سورەتێکی تر باسی نەکراوە.

٢- لەم سورەتە گشتگیرترین ئایەتی تیایە، کە باس لە خێر و شەڕ کراوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ ﴾ [النحل: ٩٠].

٣- لەم سورەتە باس لەوە کراوە کە سزا بە هاوشێوەی تاوانەکەیە.

## ١٧- سورەتی ئیسراء

١- تەنها لەم سورەتە باسی ڕووداوی شەوڕەوی کراوە، لە هیچ سورەتێکی تر باس نەکراوە.

٢- وشەی (القُرآن) لە هەموو سورەتەکانی تر زیاتر لێرە هاتووە.

٣- یەکەم سورەتە بە ڕیزبەندی سورەتەکانی قورئان بە تەسبیحات دەستی پێکردبێت.

٤- ئایەتی عیززەت لەخۆدەگرێت. (کە ئایەتی ١١١ دەکات).

## ١٨- سورەتی کەهف

١- سوننەتە لە ڕۆژی هەینی بخوێندرێت.

٢- لەبەرکردنی دە ئایەتی سەرەتای هۆکارە بۆ خۆپاراستن لە فیتنەی دەججال.

٢- نور و ڕوناکییە لەنێوان دوو هەفتە.

٣- یەکێکە لەو پێنج سورەتەی بە (الحمد) دەست پێدەکات.

## ١٩- سورەتی مەریەم

١- تەنها سورەتێکە بەناوی ئافرەتەوە ناونراوە، ئەویش مەریەمی کچی عیمران.

٢- ناوی خوای گەورە (الرحمن) وە وشەی الرحمة شانزە جار دووبارە بووەتەوە.

٣- جەعفەری کوڕی ئەبی تالیب (ڕەزای خوای لێبێت) سەرەتای ئەم سورەتەی بەسەر نەجاشی خوێندەوە موسڵمان بوو.

## ٢٠- سورەتی طاها

١- لە هەموو سورەتەکانی تر زیاتر باسی چیرۆکی پێغەمبەر موسای (سەلامی خوای لێبێت) کردووە.

٢- تەنها لەم سورەتە باس سامری دەکات کە بەنی ئیسرائیلی گومڕاکرد.

٣- لە هیچ سورەتێک باسی (الضنك واللحية) نەکراوە تەنها لەم سورەتە نەبێت.

٤- بەتایبەت لەم سورەتە باسی عەصاکەی پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێبێت) کراوە و وەسفی کراوە.

٥- تەنها لەم سورەتە فەرمان کراوە بەداوای زیادکردن (زیادبوونی عیلم).

## ٢١- سورەتی ئەنبیاء

١- لەم سورەتە باسی شانزە پێغەمبەر (سەلامی خوایان لێبێت) کراوە.
٢- لە هەموو سورەتەکانی تر زیاتر باس لە دوعای پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) هاتووە.
٣- بەتایبەت باسی دوعاکەی پێغەمبەر یونس (سەلامی خوای لێبێت) کراوە، کە هیچ موسڵمانێک نییە ئەو دوعایە بخوێنێت و بپاڕێتەوە ئیللا خوای گەورە وەڵامی دەداتەوە.
٤- لە هەموو سورەتەکانی تر زیاتر وشەی (الذكر) هاتووە کە دە جار دووبارە بووەتەوە.

## ٢٢- سورەتی حەج

١- تەنها سورەتە بەناوی یەکێک لە ڕوکنەکانی ئیسلام ناونراوە.
٢- لە هیچ سورەتێک دوو سوجدەی قورئان خوێندنی تیا نییە، تەنها ئەم سورەتە نەبێت.
٣- لەم سورەتە ئایەتێکی تیایە ڕێگە دەدات بە جیهاد کردن.
٤- بەتایبەت باسی چوار جۆرەکەی دڵی کردووە.
٥- بەتایبەت لەم سورەتە باسی مەجوسییەکان کراوە، کە ئاگر پەرستن.

## ٢٣- سورەتی مؤمنون

١- لەسەرەتای سورەتەکە یانزە ئایەتی لەخۆگرتووە وەسف و باسی باوەڕداران دەکات و حاڵ و پاداشتیان باس دەکات.
٢- پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە فەتح کردنی مەککە لە نوێژی بەیانی خوێندی لە مەککە.
٣- بەتایبەت لەم سورەتە باسی ژیانی بەرزەخ دەکات، کە ژیانێکی تایبەتە لەنێوان مردن و زیندوو بوونەوە.

## ٢٤- سورەتی نور

١- تەنها سورەتە بە (سورة) دەست پێدەکات.
٢- بەتایبەت لەم سورەتە شانزە ئایەت باسی ئەو بوهتانە دەکات بۆ عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) کرا.
٣- لەم سورەتە زۆرترین وشەی (النور)ی تیا دووبارە بووەتەوە، کە حەوت جار هاتووە.
٤- لەم سورەتە زۆرترین ضمیر لەخۆدەگرێت، کە بیست و پێنج ضمیر ی لەخۆ گرتووە.
٥- ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) وەسیێتی کردووە بەوەی ئافرەتان فێری ئەم سورەتە بکرێن.

## ٢٥- سورەتی فورقان

١- لەم سورەتە زۆرترین وشەی (تبارک) تیا هاتووە، کە سێ جارە.

٢- لەم سورەتە چواردە ئایەتی کۆتایی پێکهاتووە لە وەسفی - عباد الرحمن- باوەڕداران.

٣- لە هیچ سورەتێک لەفزی بازاڕ نەهاتووە تەنها لەم سورەتە نەبێت.

٤- باسی هەجرکردنی قورئان نەهاتووە لە قورئان جگە لەم سورەتە.

## ٢٦- سورەتی شوعەراء

١- درێژترین سورەتە لە دوای سورەتی بەقەرە لە ڕووی ئایەتەوە.

٢- تەنها سورەتە باسی الشعراء هاتووە.

٣- زۆرترین وشەی اللسان هاتووە بە چەند واتایەکی جیاواز.

٤- لەم سورەتە زۆرترین ناوی "العَزيز" و "الرَّحيم" هاتووە.

## ٢٧- سورەتی نەمل

١- ئەم سـورەتە تـایبەتكراوە كـە دووجـار بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم هاتووە.

٢- تەنها لەم سورەتە ناوی النَّمل و الهُدهُد هاتووە.

٣- لەم ســـورەتە زۆرتـــرین گفتوگـــۆ لەنێـــوان مـــرۆڤ و دروستكراوەكانی سەر زەوی هـاتووە وەكو مێرووله و هودهـود و جنۆكە و ئاژەڵ.

٤- بەتـایبەت لەم سـورەتە باسـی یەكێـك لە نیـشانەكانی ڕۆژی دوایـی كـردووە، ئەویـش ئـاژەڵێكە دەردەچێـت قـسە لەگەڵ خەڵكـی دەكات.

## ٢٨- سورەتی قەصەص

١- لەدوای سورەتی (الأعـراف و طـه) زۆرتـرین باسـی پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێبێت) لێرە باسكراوە.

٢- بەتایبەت باسی چیرۆكی قارون كراوە كە لە سورەتەكانی تـر باسی نەهاتووە.

٣- تەنها لەم سورەتە باسی ڕووداوی كوشتنی قیبتییەكە لەلایەن پێغەمبەر موسـا (سـەلامی خـوای لێبێت) دەكـات، وە دەرچـوونی بـۆ مەدیەن و ژنهێنانی لە كچی پیاو چاكەكە.

## ٢٩- سورەتی عەنکەبوت

١- لە کۆتاییترینی سورەتە کە لە مەککە دابەزیوە.
٢- تەنها سورەتی مەککی یەو باسی مونافیق دەکات.
٣- تەنها لەم سورەتە باسی جاڵجاڵۆکە دەکات کە لە سورەتەکانی تر باسی ناکات.
٤- بەتایبەت باسی ماوەی بانگەوازی پێغەمبەر نوح (سەلامی خوای لێبێت) دەکات لەناو گەلەکەی.

## ٣٠- سورەتی روم

١- بەتایبەت باسی ڕۆم دەکات.
٢- پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ لە نوێژی بەیانی خوێندوویەتی.
٣- لە هەموو سورەتەکانی تر زیاتر ئایەتی ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ هاتووە، کە حەوت جارە.
٤- بەتایبەت باسی کاتەکانی بانگ دەکات.

## ٣١- سورەتی لوقمان

١- تەنها لەم سورەتە باسی لوقمان کراوە کە لە هیچ سورەتێکی تر باس نەکراوە.
٢- باسی پێنج نهێنییەکەی غەیب کراوە کە لە ئایەتی کۆتایدا هاتووە.
٣- باسی وەسیێتەکانی لوقمان دەکات بۆ کورەکەی، کە کۆمەڵێک وەسیێتی گرنگ و بەسوود و کۆکەرەوەن.

## ٣٢- سورەتی سەجدە

١- سوننەتە لە رکاتی یەکەمی نوێژی بەیانی رۆژی جومعە بخوێندرێت.
٢- لە پێغەمبەری خواوە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هاتووە کە هەموو شەوێک پێش خەوتن خوێندوویەتی.
٣- بەتایبەت لەم سورەتە باسی -ملک الموت- فریشتەی رۆح کێشان کراوە.

## ٣٣- سورەتی ئەحزاب

١- زۆرترین بانگ لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرابێت لەم سورەتەیە کە پێنج جار بانگی لێکراوە.
٢- تەنها سورەتە کە باسی یەکێک لە هاوەڵان دەکات بە ڕاشکاوی ئەویش زەیدی کوڕی حاریثەیە (ڕەزای خوای لێبێت).
٣- لەم سورەتە بەتایبەت هانی باوەڕداران دراوە بۆ صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ.
٤- بەتایبەت باسی غەزای ئەحزاب کراوە.
٥- تەنها سورەتە کە گفتوگۆ لەگەڵ خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات.

## ٣٤- سورەتی سەبەء

١- تەنها سورەتە کە بەناوی یەکێک لە شانشینەکە ناو نراوە ئەویش شانشینی سەبەئە.
٢- بەتایبەت باسی گەلی سەبەء دەکات لە پاش ئەوەی کوفریان کرد بە نیعمەتەکانی خوای گەورە، چییان بەسەر هات.
٣- ئایەتێکی تیایە بەڵگەیە لەسەر ترسی فریشتە کاتێک کە قسەی خوای گەورە دەبیستن.

## ٣٥- سورەتی فاطر

١- لەسەرەتای سورەتەکە باسی شێوەی فریشتەکان دەکات، کە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.
٢- کۆتا سورەتە بە ڕیزبەندی موصحەف بە الحمد دەستی پێکردووە.
٤- ئەو ئایەتەی لەخۆ گرتووەکە باسی فەزڵ و گەورەیی قورئان خوێندن دەکات. (ئایەتی ٢٩-٣٥ دەکات).
٥- بەتایبەت باسی هاوار و ناڵەی کافرەکان دەکات لەناو دۆزەخ.

## ٣٦- سورەتی یاسین

١- سوننەتە لەکاتی سەرەمەرگ بخوێندرێت. (ضعیف)
٢- بەتایبەت لەم سورەتە باسی أصحاب القریة -خەڵکی شارەکە- دەکات کە لە هیچ سورەتێکی تر باسی نەهاتووە.

## ٣٧- سورەتی صافات

١- بەتایبەت لەم سورەتە باسی پێغەمبەر ئیلیاس (سەلامی خوای لێبێت) کراوە لەگەڵ گەلەکەی.
٢- کۆتایی هاتووە بە سێ ئایەت کە سوننەتە لە کۆتایی مەجلیس بوترێت. (جیاوازە لەگەڵ کەفارەتی مەجلیس).
٣- یەکەم سورەتە بە ڕیزبەندی موصحەف بە سوێند دەستی پێکردووە.

## ٣٨- سورەتی صاد

١- زۆرترین ناوی پێغەمبەر داود (سەلامی خوای لێبێت) هاتبێت لەم سورەتەیە کە پێنج جار هاتووە
٢- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سوژدەی تیا بردووە، فەرموویەتی: «داود سوژدەی برد وەکو تەوبەکردنێک، ئێمەش سوژدە دەبەین وەکو شوکرکردنی خوای گەورە».

## ٣٩- سورەتی زومەر

١- تایبەتکراوە بە وشە (الزمر) کە لە سورەتەکانی تر نەهاتووە.

٢- گەورەترین ئایەتی تیایە لەسەر کردنەوەی دەرووی خێر ﴿ قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ [الزمر: ٥٣].

٣- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ناخەوت تا ئەم سورەتەی نەخوێندایە.

## ٤٠- سورەتی غافر

١- بەتایبەت لەم سورەتە باسی پیاوە باوەڕدارەکەی خانەوادەی فیرعەون دەکات کە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.

٢- زۆرترین داتاشراوەکانی (الْحَمْدُ لله) لەم سورەتە باسکراوە کە پێنج جار هاتووە.

٣- یەکێکە لەو سورەتانەی زۆرترین باسی قیامەتی تیا هاتووە.




## ٤١- سورەتی فوصصیلەت

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ بەسەر عوتبەی کوڕی ڕەبیعە خوێندییەوە کاتێک هات بۆئەوەی دانوستان و قسەی لەگەڵدا بکات تا واز لەو بانگەوازە بهێنێت، عوتبە لێی ترسا و دەستی نایە بان دەم پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ داوای لێکرد کەوا بە ڕەحم بێت و واز لە خوێندنی ئەو سورەتەش بێنێت.

٢- ئایەتێکی تیایە ئەصڵ و بنچینەیە لەسەر هاندان بۆ دەعوە و بانگەوازکردن بۆلای خوای گەورە ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ [فصلت: ٣٣].

٣- تەنها لەم سورەتە وشەی (الأقوات) هاتووە کە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.

## ٤٢- سورة الشورى

١- ئایەتێکی لەخۆ گرتووە کە ئەصڵ و بنچینەیە لە بابی ناو و سیفاتەکانی خوای گەورە. ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١].

٢- زۆرترین وشە الوحي لەم سورەتە هاتووە، کە شەش جار دووبارە بووەتەوە

٣- هەر سێ جۆرەکەی وەحی لەخۆدەگرێت.

## ٤٣- سورەتی زوخروف

١- دوعای سەفەری لەخۆگرتووە ﴿سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ﴾ [الزخرف: ١٣ - ١٤].

٢- زۆرترین جار وشەی (ذهب) تیا هاتووە لە هەموو سورەتەکانی تر زیاتر، کە دوو جارە. (وە لە سورەتی هودیش دووجار هاتووە ئایەتی ١٠ و ٧٤).

٣- بەتایبەت باسی مالک (سەلامی خوای لێبێت) کراوە، لەم سورەتە کە سەرپەرشتی ئاگری دۆزەخ دەکات.

## ٤٤- سورەتی دوخان

١- لەناو ئەو سورەتانەی كە بە حم دەستی پێكردووە كورتترین سورەتە.

٢- پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ ئەم سورەتە و سورەتی تەكویری لە یەك ڕكاتدا خوێندووە.

٣- تەنها لەم سورەتە باسی الدخان كراوە كە یەكێكە لە نیشانەكانی ڕۆژی دوایی.

## ٤٥- سورەتی جاثیە

١- تەنها لەم سورەتە وشەی (الجاثیة) هاتووە كە لە هیچ سورەتێكی تر نەهاتووە.

٢- وشەی (آیات) لە هەموو سورەتەكانی تر زیاتر تیا هاتووە، كە دوانزە جار دووبارە بووتەوە.[٢]

---

(٢) ٣- وشەی (شریعة) تایبەت لەم سورەتە باس كراوە لە هیچ سورەتێكی تر باس نەكراوە.

## ٤٦- سورەتی ئەحقاف

١- تــایبەتکراوە بە وشــەی (الأحقــاف) کە شــاری عــادە گەلــی پێغەمبەر هود (سەلامی خوای لێبێت).

٢- کۆتا سورەتە لەو حەوت سورەتەی بە حم دەست پێدەکات.

٣- بەتــایبەت لەم ســورەتە باســی (أولــوا العــزم) کــراوە، کە پێغەمبەر نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا و محمد (علیهم الصلاة والسلام).

## ٤٧- سورەتی محمد

١- زۆرترین وشەی (أنهار) لەم سورەتە دووبارە بووەتەوە کە پێنج جار هاتووە.

٢- بەتـایبەت لەم سـورەتە باسـی چـوار ڕووبـارەکەی بەهەشـت کراوە.

٣- تەنها لەم سورەتە وشەی (أشراط) هاتووە، جگە لەم سورەتە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.

٤- لەم ســورەتە زۆرتــرین وشــەی (العمـل) و داتاشـراوەکـانی هاتووە.

## ٤٨- سورەتی الفتح

١- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووویەتی: «ئەمشەو سورەتێکم بۆ دابەزیووە لەلام خۆشەویستترە لەوەی خۆر لەسەری هەڵدێت (ئەوەی خۆر لێی دەدات)».
٢- زۆرترین وشەی (الفتح) و داتاشراوەکانی تیا دووبارە بووەتەوە، کە سێ جار دووبارە بووەتەوە.
٣- دوای صولحی حودەیبیە دابەزی.
٤- لە هەموو سورەتەکانی تر زیاتر وشەی (السكينة) تیایا دووبارە بووەتەوە، کە سێ جارە.

## ٤٩- سورەتی حوجورات

١- بەتایبەت باسی ئەم وشانەی تیاکراوە (الحجرات) و (شعوب) و (قبائل) کە ئەم وشانە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.
٢- باسی برایەتی نێوان باوەڕداران دەکات کە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە جگە لەم سورەتە.
٣- گرنگی زۆری داوە بە ئاداب و ڕەوشت، تەنانەت هەندێک لە زانایان ناویان ناوە سورة الأخلاق.

## ٥٠- سورەتی قاف

١- یەکەم سورەتی -المفصل-ە.
٢- پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ لە نوێژی بەیانی خوێندوویەتی، لەگەڵ جەژنەکان.
٣- پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ لە هەموو جومعەیەک لەسەر مینبەرەوە ئەم سورەتەی دەخوێند.

## ٥١- سورەتی ذاریات

١- پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ لە یەک ڕکاتدا ئەم سورەتە و سورەتی الطوری خوێندووە.
٢- بەتایبەت ئەم وشانەی تیا باسکراوە (﴿الْذَّارِيَات﴾، ﴿يَهْجَعُونَ﴾، ﴿سَمِينٍ﴾). کە ئەم وشانە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.
٣- ئایەتێکی تیایە ئەصڵ و بنچینەیە لە حیکمەتی دروستبوونی جنۆکە و مرۆڤ ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ﴾ [الذاريات: ٥٦].

## ٥٢- سورەتی طور

١- یەکێک لەو پێنج تەحەددایەی تیایە کە هەموو عەرەب نەیان توانی وەکو قورئان بهێنن کە کۆتا سورەتە لەو پێنج سورەتە.
٢- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ لە نوێژی مەغریب خوێندوویەتی.
٣- بەتایبەت لەم سورەتە باسی (البیت المعمور -﴿وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ﴾ [الطور: ٤]-) کراوە، لە هیچ سورەتێکی تر باس نەکراوە.
٤- تەنها لەم سورەتە باسی ناوی خوای گەورە کراوە ﴿ٱلۡبَرُّ ﴾ [الطور: ٢٨ ]. کە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.

## ٥٣- سورەتی نەجم

١- ئەم سورەتە تایبەتە بە سوجدە بردنی هاوبەش بڕیاردەران لەگەڵ مرۆڤ جن، کاتێک گوێیان لەم سورەتە بوو.
٢- لەم سورەتە بەتایبەت باس لە میعراج کراوە.
٣- دوو ئایەت لەخۆدەگرێت بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە ئەو دینەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ پێی هاتووە لەلایەن خوای گەورەوەیە.

## ٥٤- سورەتی قەمەر

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزان خوێندوویەتی.
٢- بەتایبەت باسی لە لەت بوونی مانگ کردووە، یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وە یەکێکە لە نیشانە بچوکەکانی ڕۆژی دوایی.
٣- ئایەتێکی تیایە بەڵگەیە لەسەرئەوەی ئەم قورئانە ئاسانە بۆ خوێندنەوە و لەبەرکردن و بیرکردنەوە لێی.
٤- ناوی خوای گەورە (الله) لەم سورەتە نەهاتووە.

## ٥٥- سورەتی ڕەحمان

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە یەک ڕکاتدا لەگەڵ سورەتی النجم خوێندوویەتی.
٢- پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەسەر جنۆکەکان خوێندوویەتی.
٣- تەنها سورەتە دەستی پێکردووە بە یەکێک لە ناوەکانی خوای گەورە.

## ٥٦- سورەتی واقیعە

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە نوێژی بەیانی خوێندوویەتی.

٢- زۆرترین وەسفی نازونیعمەتەکانی ئەهلی بەهەشتی لەخۆگرتووە.

٣- لە ڕیزبەندی موصحەف یەکەم سورەتە بە مەرج دەستی پێکردووە.

## ٥٧- سورەتی حەدید

١- یەکەم سورەتی مەدەنی یە بە تەسبیحات دەستی پێکردووە.

٢- دەستی پێکردووە بە کۆمەڵێک لە ناوەکانی خوای گەورە.

٣- تەنها لەم سورەتە باسی حاڵی موونافیقەکان دەکات لەسەر پردی سیراط.

٤- بەتایبەت باس لە دابەزینی ئاسن دەکات.

# ٥٨- سورەتی موجادەلە

١- تەنها سورەتە لە هەموو ئایەتەکان ناوی خوای گەورە (الله)ی تیایە.

٢- تەنها سورەتە بە ﴿قَدْ سَمِعَ﴾ دەستی پێکردووە کە هیچ سورەتێکی تر نییە بەم ڕستەیە دەستی پێکردبێت.

٣- زۆرترین وشەی (النجوى) و داتاشراوەکانی لێرە هاتووە، کە دە جار دووبارە بووەتەوە.

## ٥٩- سورەتی حەشر

١- ئـایەتێکی لەخۆگرتـووە کە ئەصڵ و بنچینەیە لەسـەرئەوەی سـوننەتی پێغەمـبەری خـوا ﷺ بەڵـگەیە و دەبێـت کـاری پێبکرێت ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ﴾ [الحشر: ٧].

٢- ئـایەتێکی تیـایە ئەصـڵ و بنچیـنەیە لەسـەر خۆشویـستنی هـاوەڵانی پێغەمـبەری خـوا ﷺ و بێـدەنگ بـوون لەوەی ڕوویداوە لە نێوانیان ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾ [الحشر: ١٠].

٣- لەدوای غەزای بەنی نەضیر دابەزی.

## ٦٠- سورة مومتەحەنە

١- تەنهـا سـورەتە زۆرتـرین وشـەی (المَوَدَّة)ی تیـا دووبـارە بووەتەوە کە سێ جارە.

٢- کۆتـا سـورەتە دەسـت پێدەکات بە بـانگکردنی بـاوەڕداران بە ڕیزبەندی موصحەف.

٣- بەتایبەت باسی بەیعەتی ئافرەتان دەکات.

## ٦١- سورەتی صەف

١- ئایەتێک لەخۆدەگرێت کە پێغەمبەر عیسا (علیه الصلاة والسلام) موژدەی داوە بە هاتنی پێغەمبەر محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.
٢- بەتایبەت باسی یەکێک لە ناوەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەکات أحمد، کە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە جگە لەم سورەتە.
٣- زۆرترین وشەی (أنصار) لەم سورەتەدا هاتووە.

## ٦٢- سورەتی جومعە

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی جومعە خوێندوویەتی.
٢- بەتایبەت ناوی جومعە هاتووە کە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.
٣- تەنها سورەتە بەناوی ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی هەفتەوە هاتبێت.

## ٦٣- سورەتی المنافقون

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە ڕکاتی دووەم لە نوێژی جومعە خوێندوویەتی.
٢- لە دوای غەزای بەنی موصطەلیق دابەزی لە ساڵی شەشی کۆچی.
٣- لە هیچ سورەتێکی تر باسی لاشەی مونافیقەکان نەکراوە جگە لەم سورەتە.

## ٦٤- سورەتی التغابن

١- یەکێکە لەو سورەتانەی بە تەسبیحات دەستی پێکردووە.
٢- بەتایبەت لەم سورەتە باسی (التغابن) کراوە، کە لە هیچ سورەتێکی تر باس نەکراوە.
٣- دابەشکردنی خەڵکی لەخۆگرتووە یان کافرن یان باوەڕدار.
٤- بەتایبەت باسی لە هەندێک دوژمنایەتی ژن و منداڵی کردووە.

## ٦٥- سورەتی تەڵاق

١- یەکێکە لەو سێ سورەتەی بە بانگکردنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستی پێکردووە.
٢- لە قورئاندا هیچ ئایەتێک نییە وەکو ئەم ئایەتە بە پەلە دەرووی خێر بکاتەوە: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا﴾ [الطلاق: ٢].
٣- تەنها سورەتە زۆرترین ئایەتی ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ﴾ تیا دووبارە بووەتەوە.
٤- بەتایبەت باسی عیددەی ئافرەتی دووگیان دەکات.

## ٦٦- سورەتی التحريم

١- کۆتا سورەتە بە ڕیزبەندی موصحەف بە بانگکردنی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ دەست پێ بکات.
٢- ئایەتێکی تیایە ئایەتێکی گشتگیرە لە وەسفی ئافرەت و ژنی چاک.
٣- بەتایبەت باسی لە چوار ئافرەت کردووە ئەوانیش: خێزانەکەی نوح و خێزانی لوط (سەلامی خوایان لێبێت)، و خێزانی فیرعەون و مەریەم.

# ٦٧- سورەتی الملک

١- کۆتا سورەتە بە پێی ڕیزبەندی موصحەف بە وەسفکردنی خوای گەورە دەست پێدەکات.

٢- لە ڕۆژی دوایی شەفاعەت بۆ ئەو کەسە دەکات خوێندوویەتی.

٣- پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ ناخەوت تا ئەم سورەتەی نەخوێندایە.

٤- لە هەموو سورەتەکانی تر زیاتر وشەی (البَصَر)ی تیا دووبارە بووەتەوە کە سێ جار دووبارە بووەتەوە.

٥- هاوەڵان ناویان بردووە بە (الْمنُجِيَة) چونکە خاوەنەکەی ڕزگار دەکات لە ئاگری دۆزەخ، وە (الْمَانِعة) ناویان بردووە، چونکە ڕێگری سزای ناو گۆڕ دەکات. [٣]

---

(٣) م. صلاح الدين عبدالكريم.

## ٦٨- سورەتی قەڵەم

١- یەکێکە لەو سورەتانەی قورئان کە یەکەمجار دابەزیوە.
٢- کۆتا سورەتە بە ڕیزبەندی موصحەف بە تەنها پیتێکی هیجائی دەستی پێکردووە.
٣- بەتایبەت باسی لە هاوەڵانی باخەکە کردووە.
٤- ئایەتێکی لەخۆگرتووە کە زۆرترین وەسفی ڕەوشتی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەکات: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ [القلم: ٤].

## ٦٩- سورەتی حاققە

١- بەتایبەت باسی وشەی ﴿ ٱلۡحَآقَّةُ ﴾ دەکات کە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.
٢- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەم سورەتە و سورەتی القمر لە یەک ڕکاتدا خوێندووە.
٣- زۆرترین (هاء السكت) هاتبێت لە قورئاندا لەم سورەتەیە کە پێنج جار هاتووە.
٤- تەنها لەم سورەتە باسی ژمارەی هەڵگرانی عەرش کراوە.

## ٧٠- سورەتی معارج

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەم سورەتە و سورەتی النازعات لە یەک ڕکاتدا خوێندووە.

٢- تەنها سورەتە بەم ﴿سَأَلَ سَآئِلُۢ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ﴾ دەستی پێکردووە.

٢- ئەم وشەیە (فَصِيلَتِهِ) لە قورئان نەهاتووە جگە لەم سورەتە نەبێت.

## ٧١- سورەتی نوح

١- کۆتا سورەتە بە پێی ڕیزبەندی موصحەف بە ناوی یەکێک لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ناونراوە.

٢- باسی ئەو پێنج بتە کراوە کە لە غەیری خوای گەورە پەرستراوە.

٣- سوننەتە لە نوێژە بارانە بخوێنرێت. (وتەی هەندێک لە فوقەها و زاناکانە -وەرگێڕ-).

٤- بەتایبەت باسی دوعاکەی نوح (سەلامی خوای لێبێت) کراوە لە گەلەکەی خۆی کرد.

## ٧٢- سورەتی جن

١- یەکەم سورەتە بە پێی ڕیزبەندی موصحەف بە فەرمان ﴿قُلْ﴾ دەست پێدەکات.
٢- زۆرترین باسی جنۆکە و ژیانیان و شتی سەیر و سەمەرەیان باس دەکات.
٣- باسی عیبادەتکردنی مرۆڤ دەکات بۆ جنۆکەکان.
٤- وەسفی گەمژەیی ئیبلیس نەکراوە تەنها لەم سورەتە نەبێت.

## ٧٣- سورەتی موززەممیل

١- تەنها سورەتە کۆتایی سورەتەکە سەرەتای سورەتەکەی نەسخ کردووەتەوە.
٢- یەکەم سورەتە دابەزیوە بە ڕێگەپێدان بە شەونوێژ.
٣- کۆتا ئایەتی ئەم سورەتە تەنها ئایەتێکە لە قورئان زۆرترین ناوی خوای گەورە (الله) تیا دووبارە بووبێتەوە کە حەوت جار دووبارە بووەتەوە.
٤- وشەی (التبتل) نەهاتووە لە قورئان جگە لەم سورەتە.

## ٧٤- سورەتی موددەثیر

١- یەکەم سورەتە لەدوای بچڕانی وەحی دابەزیووە.
٢- کۆتا سورەتە بە پێی ڕیزبەندی موصحەف بە بانگکردن دەست پێبکات.
٣- بەتایبەت باسی ژمارەی دەرگاوانی دۆزەخ کراوە (سەلامی خوایان لێبێت).
٤- چەند ئایەتێکی لەسەر وەلیدی کوڕی موغیرە دابەزیووە.

## ٧٥- سورەتی قیامە

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەم سورەتە و سورەتی الإنسان لە یەک ڕکاتدا خوێندووە.
٢- دوو ئایەتی تیایە کە ئەصڵ و بنچینەن لەسەر بینینی خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی. ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ [القيامة: ٢٢ - ٢٣].
٣- لەم سورەتە ناوی خوای گەورە (الله) نەهاتووە.
٤- وەسفی سەرەمەرگ و مردن دەکات.

## ٧٦- سورەتی ئینسان

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە ڕکاتی دووەمی نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعە خوێندوویەتی.
٢- یەکەم سورەتە بەپێی ڕیزبەندی موصحەف بەشێوەی پرسیار دەست پێدەکات.
٣- لەدوای سورەتی الرحمن و الواقعة زۆرترین وەسفی ناز و نیعمەتی ئەهلی بەهەشت لەم سورەتە کراوە.

## ٧٧- سورەتی مورسەلات

١- کۆتا سورەتە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێشنوێژی پێکردووە بۆ هاوەڵانی پێش وەفاتکردنی.
٢- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەم سورەتە لەگەڵ سورەتی النبأ لە یەک ڕکاتدا خوێندوویەتی.
٣- ناوی خوای گەورە (الله) لەم سورەتە نەهاتووە.
٤- کۆتا سورەتی طوال المفصل.

## ٧٨- سورەتی نەبەء

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خوێندوویەتی لەگەڵ سورەتی المرسلات لە یەک ڕکاتدا.

٢- ناوی خوای گەورە (الله) لەم سورەتە نەهاتووە.

٢- یەکەم سورەتی أوساط المفصل ئەم سورەتەیە.

٣- قورسترین ئایەتی تیایە لەسەر ئەهلی دۆزەخ ﴿فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا﴾ [النبأ: ٣٠].

## ٧٩- سورەتی نازیعات

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەم سورەتەی لەگەڵ سورەتی المعارج لە یەک ڕکاتدا خوێندووە.

٢- ئەم لەفزانەی بەتایبەت تیا باسکراوە، کە لە هیچ سورەتێکی تر باس نەکراوە (النَّازِعَات، السَّاهِرَة، الطَّامَّة).

٣- بەگوێرەی ڕێکخستنی موصحەف کۆتا سورەتە کە ئایەتی ﴿يَسْـَٔلُونَكَ﴾ لەخۆ گرتبێت.

٤- قسەی فیرعەونی تێدا باسکراوە کە بانگەشەی خوایەتی دەکات.

## ٨٠- سورەتی عەبەس

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ ئەم سورەتەی لەگەڵ سورەتی المطففين لە یەک ڕکاتدا خوێندووە.
٢- کۆتا گلەیی خوای گەورەیە بەپێی ڕیزبەندی موصحەف لە پێغەمبەرەکەی صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ.
٣- چەند ئایەتێکی لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم (ڕەزای خوای لێبێت) دابەزیووە.

## ٨١- سورەتی تەکویر

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ لە نوێژی بەیانی خوێندوویەتی.
٢- یەکێکە لەو پێنج سورەتەی کە پێغەمبەری خوای صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ پیرکرد.
٣- یەکێکە لەو سێ سورەتەی ئەوەی دەیخوێنێتەوە وەکو ئەوەیە بەچاوی خۆی قیامەت ببینێت.
٤- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ لەگەڵ سورەتی الدخان لە یەک ڕکاتدا خوێندوویەتی.
٥- هەواڵی کچی زیندەبەچاڵکراو باس دەکات.

## ٨٢- سورەتی ئینفیطار

١- یەکێکە لەو سێ سورەتەی ئەوەی دەیخوێنێتەوە وەکو ئەوەیە بەچاوی خۆی قیامەت ببینێت.
٢- یەکێکە لەو سێ سورەتەی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ وەسێتی کرد بۆ موعاذ (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێک پێشنوێژی دەکات لە نوێژی عیشا بیخوێنێت.

## ٨٣- سورة موطەففین

١- ناوی خوای گەورە (الله) لەم سورەتە نەهاتووە.
٢- یەکەم سورەتە بەپێی ڕیزبەندی موصحەف بە دوعا دەست پێدەکات. (یەکێکە لەو دوو سورەتەی بە ﴿وَيۡلٞ﴾ دەستی پێکردووە -وەرگێڕ-).
٣- ئایەتێکی تیایە ئەصڵ و بنچینەیە لەسەرئەوەی تاوانی زۆر دڵ نەخۆش و ڕەق دەکات ﴿كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ [المطففين: ١٤].
٤- بەتایبەت باسی یەکێک لە کانی یەکانی بەهەشت دەکات ﴿تَسۡنِيمٍ﴾ [المطففين: ٢٧].

## ٨٤- سورەتی ئینشیقاق

١- یەکێکە لەو سێ سورەتەی ئەوەی دەیخوێنێتەوە وەکو ئەوەیە بەچاوی خۆی قیامەت ببینێت.

٢- سوژدەی قورئان خوێندنی تیایە کە یەک سورەتێک پێش کۆتا سورەتە لە سوژدەی قورئان خوێندن بە پێی ڕیزبەندی موصحەف.

٣- تەنها لەم سورەتە باسی کتێب وەرگرتن کراوە کە لە پشتەوە پێی دەدرێت.

## ٨٥- سورەتی البروج

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر خوێندوویەتی.

٢- بەتایبەت باسی أصحاب الأخدود کراوە کە لە هیچ سورەتێکی تر باس نەکراوە.

٣- ناوی خوای گەورە ﴿ٱلۡغَفُورُ﴾ نەهاتووە پێکەوە لەگەڵ ﴿ٱلۡوَدُودُ﴾ لە قورئان تەنها لێرە نەبێت.

٤- عەرشی خوای گەورە ناونەبراوە بە ﴿ٱلۡمَجِيدُ﴾ تەنها لەم سورەتە نەبێت.

## ٨٦- سورەتی طاریق

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ له نوێژی نیوەڕۆ و عەسر خوێندوویەتی.

٢- یەکێکە لەو سێ سورەتەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەسیێتی کرد بۆ موعاذ (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێک پێشنوێژی دەکات لە نوێژی عیشا بیخوێنێت.

٣- ناوی خوای گەورە (الله) لەم سورەتە نەهاتووە.

٤- لە قورئان نەهاتووە باسی ئەوە بکات مرۆڤ لە پشتی پیاو و سنگی ئافرەت دەردەچێت تەنها لەم سورەتە نەبێت.

## ٨٧- سورەتی ئەعلا

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە هەردوو نوێژی جەژن و جومعە و نیوەڕۆ خوێندوویەتی.

٢- کۆتا سورەتە بەپێی ڕیزبەندی موصحەف بە وەسف و سەنای خوای گەورە دەستی پێکردووە.

٣- کۆتا سورەتە بە پێی ڕیزبەندی موصحەف باسی یەکێک لە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) بکات.

٤- باسی صەحیفە و پەڕاوی پێغەمبەر ئیبراهیم و موسا (سەلامی خوایان لێبێت) دەکات.

## ٨٨- سورەتی غاشیە

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە نوێژی جەژن و جومعە خوێندوویەتی.

٢- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە نوێژی نیوەڕۆ خوێندوویەتی.

٣- لە هیچ سورەتێک وشەی (نَمَارِق) نەهاتووە جگە لەم سورەتە.

٤- لە هیچ سورەتێک وشەی (زَرَابِي) نەهاتووە جگە لەم سورەتە.

## ٨٩- سورەتی فەجر

١- ناوی خوای گەورە (الله) لەم سورەتە نەهاتووە.

٢- یەکێکە لەو سورەتانەی لە سەرەتای وەحی دابەزیوە لە مەککە.

٣- بەتایبەت هەندێک وشە لەم سورەتە هاتووە کە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە (الْشَّفْع - الْوِتْر - إِرَم).

٤- بەتایبەت باسی یەکێک لەو سێ نەفسە باسکراوە ئەویش: ﴿ ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴾ [الفجر: ٢٧].

## ٩٠- سورەتی بەلەد

١- ناوی خوای گەورە (الله) نەهاتووە لەم سورەتە.

٢- بەتایبەت هەندێک وشە هاتووە لەم سورەتە ﴿كَبَدٍ﴾ ﴿ٱلْعَقَبَةَ﴾ کە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.

٣- زۆرترین وشەی ﴿أَيَحْسَبُ﴾ لەم سورەتە دووبارە بووەتەوە لەگەڵ سورەتی القیامة.

٤- لە قورئاندا باسی ﴿أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ﴾ نەهاتووە تەنها لەم سورەتە نەبێت.

## ٩١- سورەتی شەمس

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە نوێژی عیشا خوێندوویەتی.
٢- سورەتەکە دەستی پێکردووە بە پانزە سوێند یەک بەدوای یەک.

٣- وشەی ﴿دَسَّىٰهَا﴾ نەهاتووە لە قورئان جگە لەم سورەتە.

٤- لە هیچ سورەتێک وشەی ﴿فَدَمْدَمَ﴾ نەهاتووە جگە لەم سورەتە.

## ٩٢- سورەتی لەیل

١- پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ لە نوێژی نیوەڕۆ خوێندوویەتی.
٢- کۆتا سورەتە لە سورەتەکانی أوساط المفصل.
٣- زۆرترین وشەی ڕووبەڕوو و بەرامبەری لەخۆگرتووە.
٤- کۆتایی ئایەتەکانی لەسەر ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێبێت) دابەزی.
٥- ناوی خوای گەورە (الله) لەم سورەتە نەهاتووە.

## ٩٣- سورەتی زوحا

١- یەکێکە لەو سێ سورەتەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ وەسیێتی کرد بۆ موعاذ (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێک پێشنوێژی دەکات لە نوێژی عیشا بیخوێنێت.
٢- یەکەم سورەتە لە سورەتەکانی قصار المفصل.
٣- ناوی خوای گەورە (الله) نەهاتووە لەم سورەتە.
٤- لەدوای بچڕانی وەحی دابەزی.
٥- باسی باسکردنی نیعمەت نەهاتووە لە قورئان جگە لەم سورەتە.

## ٩٤- سورەتی شەرح

١- ناوی خوای گەورە (الله) نەهاتووە لەم سورەتە.
٢- یەکێکە لەو شەش سورەتەی بە شێوەی سەرسورمان دەستی پێکردووە.
٣- موژدەیەکی گەورەی تێدایە کە نارەحەتی و سەغڵەتی بەسەر دوو سوکی و ئاسانی سەرناکەوێت.

## ٩٥- سورەتی تین

١- پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ لە نوێژی عیشا خوێندوویەتی.
٢- ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ئەو ساڵەی کە شەهید کرا خوێندوویەتی لە نوێژی بەیانی لە مەککە.
٣- بەتایبەت باسی (التین) کراوە کە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.
٤- (أَحْكَم الْحَاكِمِين) نەهاتووە لە قورئان تەنها لەم سورەتە نەبێت لەگەڵ سورەتی هود.

## ٩٦- سورەتی عەلەق

١- پێنج ئایەتی یەکەم، ئەو ئایەتانەن یەکەمجار دابەزی بۆ سەر پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە کێوی حیراء.
٢- کۆتا سوژدەی قورئان خوێندن بە پێی ڕیزبەندی موصحەف ئەم سورەتەیە.
٣- باسی فێربوون نەکراوە بەهۆی قەڵەمەوە تەنها لەم سورەتە نەبێت.
٤- باسی ﴿ٱلزَّبَانِيَةَ﴾ نەکراوە لە قورئان تەنها لەم سورەتە نەبێت.

## ٩٧- سورەتی قەدر

١- ناوی خوای گەورە (الله) نەهاتووە لەم سورەتە.
٢- تایبەتکراوە بە ناوی (القدر) کە لە هیچ شوێنێکی تر نەهاتووە لە قورئان جگە لەم سورەتە.
٣- بەتایبەت باسی فەزڵ و گەورەیی شەوی قەدر دەکات.

## ٩٨- سورەتی بەیینە

١- خوای گەورە فەرمانی کرد بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە ئەم سورەتە بخوێنێت بەسەر ئوبەی کوڕی کەعب (ڕەزای خوای لێبێت).

٢- تایبەتکراوە بە هەندێک وشە ﴿ٱلْبَيِّنَةُ﴾ ﴿مُنفَكِّينَ﴾ ﴿قَيِّمَةٌ﴾ ﴿ٱلْبَرِيَّةِ﴾ کە لەهیچ سورەتێکی تر نەهاتووە جگە لەم سورەتە.

## ٩٩- سورەتی زەلزەلە

١- ناوی خوای گەورە (الله) نەهاتووە لەم سورەتە.

٢- بەتایبەت باسی زەوی دەکات کەچی لەسەر کراوە.

٣- باسی ئەوە نەکراوە چی لەناو سکی زەوی هەیە هەمووی دەردەچێت لەڕۆژی دوایی تەنها لەم سورەتە نەبێت.

## ١٠٠- سورەتی العادیات

١- ناوی خوای گەورە (الله) لەم سورەتە نەهاتووە.

٢- بەتایبەت هەندێک وشە هاتووە ﴿الْعَادِيَات﴾ ﴿ضَبْحًا﴾ ﴿الْمُورِيَات﴾ ﴿قَدْحًا﴾ ﴿الْمُغيرَات﴾ ﴿لَكَنُودٌ﴾ لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.

## ١٠١- سورەتی قاریعە

١- ناوی خوای گەورە (الله) نەهاتووە لەم سورەتە.

٢- زۆرترین وشەی ﴿ٱلْقَارِعَةُ﴾ هاتبێت لە قورئان لەم سورەتەیە کە سێ جار دووبارە بووەتەوە.

## ١٠٢- سورەتی تەکاثور

١- ناوی خوای گەورە (الله) نەهاتووە لەم سورەتە.

٢- تایبەتکراوە بە باسکردنی ئەو سێ شتەی بەدەوری مرۆڤەوەیە (الْدُّنْيا – الْبَرْزَخ – الآخِرَة).

## ١٠٣- سورەتی عەصر

١- کۆتا سورەتە بە پێی ڕیزبەندی موصحەف بە سوێند دەست پێدەکات.

٢- پێکهاتووە لە سێ ئایەت، دە -واو-ی تیایە.

٣- کورتترین سورەتە لە قورئان.

٤- هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێت) کردبوویانە دروشمی خۆیان لە کاتی بە یەک گەیشتنیان دەیانخوێند.

## ١٠٤- سورەتی هومەزە

١- یەکێکە لەو سێ سورەتەی بە دوعا دەستی پێکردووە. (یەکێکە لەو دوو سورەتەی بە ﴿وَيۡلٌ﴾ دەستی پێکردووە -وەرگێڕ-).

٢- بەتایبەت ئەم وشەیەی ﴿ٱلۡحُطَمَةِ﴾ تیایە کە لە هیچ سورەتێکی تری قورئان نەهاتووە.

## ١٠٥- سورەتی فیل

١- ناوی خوای گەورە (الله) نەهاتووە لەم سورەتە.
٢- تەنها لەم سورەتە چیرۆکی هاوەڵانی فیلەکە باسکراوە کە لە هیچ سورەتێکی تر باس نەکراوە.
٣- بەتایبەت ئەم وشانەی ﴿ٱلۡفِيلِ﴾ ﴿أَبَابِيلَ﴾ ﴿مَّأۡكُولِۭ﴾ تیا هاتووە کە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.

## ١٠٦- سورەتی قورەیش

١- تەنها سورەتە بەشێوەی هۆکار دەستی پێکردووە.
٢- ناوی خوای گەورە (الله) نەهاتووە لەم سورەتە.
٣- وشەی ﴿قُرَيۡشٍ﴾ نەهاتووە لە هیچ سورەتێک تەنها لەم سورەتە نەبێت.
٤- وشەی ﴿ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ﴾ نەهاتووە لە قورئان تەنها لەم سورەتە نەبێت.

## ١٠٧- سورەتی ماعون

١- کۆتـا سـورەتە بە پێـی ڕیزبەنـدی موصـحەف بەشـێوەی سەرسوڕمان دەستی پێکردووە.
٢- ناوی خوای گەورە (الله) لەم سورەتە نەهاتووە.
٣- وشەی ﴿ٱلۡمَاعُونَ﴾ نەهاتووە لە قورئان جگە لەم سورەتە.
٤- وەیل و هاوار بۆ نوێژخوێنان نەهاتووە لە قورئان جگە لەم سورەتە، ئەویش بۆ ئەو کەسانەیە: ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ﴾ .

## ١٠٨- سورەتی کەوثەر

١- کـورتترین سـورەتە لە هەمـوو قورئـان لە ڕووی وشـە و پیتەوە.
٢- کۆتـا سـورەتە بەپێـی ڕیزبەنـدی موصـحەف کە بە ڕسـتەی هەواڵ -الخبر- دەست پێدەکات.
٣- هەندێک وشەی تێدایە ﴿ٱلۡكَوۡثَرَ﴾ ﴿انْحَر﴾ ﴿ٱلۡأَبۡتَرُ﴾ کە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە.

## ١٠٩- سورەتی کافرون

١- سوننەتە پێش خەوتن بخوێنرێت. (لە سوننەتی نوێژی بەیانی، و ویتر، و تەواف سوننەتی دوای نوێژی مەغریب)

٢- بەرائەت بوونە لە شرک.

٣- چواریەکی قورئانە.

## ١١٠- سورەتی نەصر

١- کۆتا سورەتی مەدەنی یە بەپێی ڕیزبەندی موصحەف.

٢- کۆتا سورەتە بەپێی ڕیزبەندی موصحەف کە بە مەرج دەست پێدەکات.

٣- کۆتا سورەتە کە هەمووی پێکەوە دابەزی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

٤- ئامـاژەی تیایە بۆ وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵئاوایی لە دونیا بکات و لەوەی تیایەتی.

٥- لە هیچ سورەتێکی تردا سەرکەوتن پەیوەست نەکراوە بە فەتحەوە تەنها لەم سورەتە نەبێت.

## ١١١- سورەتی مەسەد

١- کۆتا سورەتە بەپێی ڕیزبەندی موصحەف دەست پێدەکات بە دوعا.

٢- ئەم سورەتە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر موعجیزەی قورئان و ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

٣- تەنها لەم سورەتە ناوی ئەبو لەهەب و خێزانەکەی هاتووە.

## ١١٢- سورەتی ئیخلاص

١- سێ یەکی قورئانە.

٢- بەتایبەت لەم سورەتە دوو ناوی خوای گەورە هاتووە لە هیچ سورەتێکی تر نەهاتووە (الأَحَد، الْصَّمَد).

٣- خوێندنی سوننەتە لە زیکری بەیانیان و ئێواران و کاتی خەوتن. (دوای نوێژە فەرزەکان و نوێژی ویتر و سوننەتی بەیانی و سوننەتی مەغریب).

٤- یەکێکە لەو سورەتانەی بۆ ڕوقیە بەکاردێت.

## ١١٣- سورەتی فەلەق

١- یەکێکە لەو سورەتانەی بۆ ڕوقیە بەکاردێت.
٢- سوننەتە خوێندنی لە زیکری بەیانیان و ئێواران و کاتی خەوتن و دوای نوێژە فەرزەکان.
٣- دەیسەلمێنێت کە سحر و حەسوودی هەیە.

## ١١٤- سورەتی ناس

١- بەپێی ڕیزکردنی سورەتەکان لە قورئان کۆتا سورەتە.
٢- بەپێی ڕیزبەندی موصحەف کۆتا سورەتە.
٣- یەکێکە لەو سورەتانەی بۆ ڕوقیە بەکاردێت.
٤- لە زیکری بەیانیان و ئێواران و کاتی خەوتن و لەدوای نوێژە فەرزەکان دەخوێنرێت.

